# حەوت برا




وەرگێڕانی
مستەفا ئێلخانی زادە



وەزارەتی رۆشنبیری
زنجیرە کتێبی منداڵان

# حەوت برا

نووسینی: مارگارت می

وەرگێڕانی

**مستەفا ئێلخانی زادە**



**خاوەنی ئیمتیاز: وەزیری رۆشنبیری**
**سەرنووسەر: نیان ئەحمەد**

ناوی کتێب: حەوت برا
زنجیرەی کتێب: ١١
وەرگێڕانی: مستەفا ئێلخانی زادە
دەرهێنانی هونەری: ئاسۆ خالید
وێنەکان: لە کتێبەکە وەرگیراوە
پیتچنین: نیان جەمال
سەرپەرشتیاری چاپ: عەبدولقادر عەلی مەردان
ژمارەی سپاردن: (٥٠٦) بۆ ساڵی ٢٠٠٦
چاپ: یەکەم - ٢٠٠٦
چاپخانەی وەزارەتی کشتوکاڵ
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخی: ٥٠٠ دینارە

له ڕۆژگارێکدا کەچین شی هانگ ئیمپراتۆری چین بوو، حەوت برا لە دەریایەکی سەوزو خۆشدا دەژیان، ئەو حەوت برایە وەک یەک بەڕێدا دەڕۆیشتن، وەک یەک قسەیان دەکردو ئەوەندە بە یەک دەچوون زۆر بە زەحمەت لێک جیا دەکرانەوە، ئەو حەوت برایە هەر کامیان هێزو توانایەکی سەیریان بوو.



برای یەکەم بە گوێیە سەیرەکانی دەیتوانی دەنگی فڕینی مێش لە دوورەوە ببیستێ، دووهەمین برا بە چاوە بەحوکمەکانی دەیتوانی لە شوێنی زۆر دوورەوە مێشێک بەسەر دیواری چینەوە ببینێ، برای سێهەم ئەوەندە بە هێزبوو دەیتوانی لە پشوودانێکدا، تەواوی چین بگەڕێ و ئەگەر کێوێک لەسەر ڕێی بێ، هەڵیگرێ و لەولای دانێ. برای چوارەمیش زۆر بەهێزبوو. ئێسکی پۆڵاییینی، هەرگیز بانەدەدراو نەدەچەماوەو نەدەشکا.







برای پێنجەمیان دەیتوانی هەر چەندی بیەوێ لاقی هەڵێنێتەوە. برای شەشەم هەرگیز گەرمای نەدەبوو، تەنانەت ئەگەر لە ژێر خۆرەتاوی گەرمی هاویندا سەخترین کاری کردبا، برای حەوتەم لە هەموویان بچکۆڵەتر بوو شەش براکەی دیکەی تێدەکۆشان هەمیشە کارێکی وا بکەن ئەو خۆشحاڵ بێ، چونکە ئەگەر نارەحەت دەبوو دەگریا، هەر تنۆکە فرمێسکێکی سوێری ئەو دەیتوانی دێیەک نوقم کا.









ئەو حـەوت برایە بە خـۆشی و بەشـادی دەژیان و قـەت وا نەدەبوو برا بچکۆلّەکە بگری. بەڵام ڕۆژێک کـە خەریکی کـار بوون، برای یەکـەم کە گـوێیەکی سەیری هەبوو، سەری کـەج کـرد گوتی: «لەودوور دوورانەوە، لەتەنیشت دیواری چین دەنگی ناڵەو ڕۆ ڕۆ دەبیستم!»

به برای دووهەمی گـوت: «چاولێکە لەوێ چ خـەبەرە؟» برای دووهەم بەچاوە بە حـوکـمـەکـانی خـۆی چاوی لە دیواری کـرد و گـوتی: «وای! بەشێکی گەورەی دیوار ڕووخاوەو سەدان پیاوی هەژار خەریکی کارن. ئەوان بۆ کەڵتەکردنی دیوار دەبێ شەو و ڕۆژ کار بکەن، هەر بۆیە ماندوو بێ هێز بوون. دەڵێی ئیجازەی خواردن و خەویشییان نییە.



برای حەوتەمین کە هەمیشە برسی بوو، گوتی: «من ناتوانم لە ئاست ئەو ستەمە بێدەنگ بم.» دەیویست بگری. برای سێهەم گوتی: «مەگری من دەچم و کۆمەکیان دەکەم.» برای سێهەم هەڵات و لە چرکە ساتێک دا گەیشتە دیواری چین و دەست بەکاربوو. بەردە قورسەکان لە دەستە بەهێزەکانی ئەودا وەک پەڕەکایەک سووک بوون. کاتی ڕۆژئاوابوو، دیوار کەڵتەکرا بوو. برای سێهەم ڕاکشا هەتا ماندووی بحەسێتەوە.



کاتێک ئیمپراتۆر بیستی پیاوێک بە تەنێ لە چەند کاتژمێرێکدا دیوارەکەی کەلّتە کردوو، نەک هەر خۆشحالّ نەبوو بەلّکو هەستی بە مەترسی کردو بە خۆی گوت: پیاوێکی بەو هێزو توانایەوە بۆ ئێمە خەتەرە! مرۆڤە بەتواناکان بەکاری ئیمپراتۆرەکان دێن، لەوانەیە لەشکرێک نەتوانێ بیگرێ، کەوا بوو دەبێ دوو لەشکری بۆ بنێرم! کاتێ «برای سێهەم لەخەو وەخەبەر هات، دیتی سەربازەکانی دوو لەشکر دەوریان داوە. فەرماندەکانی هەردوو سوپاکە وێکرا گوتیا: «بەبڕیاری ئێمپراتۆری گەورە ئەتۆ مەحکووم بە نەمان بووی و بەیانی ئەو حوکمە جێبەجێ دەکرێ!» بە سەربازەکانی خۆیان فەرمانی دا بەزیندانی بیبەن بۆ کۆشک.

برای سێهەم نارەحەت بوو گریا.





له دوور ڕا لەناو دەرەیەکی جواندا یەکەمین برا دەنگی گریانی ئەوی گوێ لێبوو گوتی: «براکەمان دەگریێ؛ حەتمەن تووشی کارەساتێک بووە!»

برای دووهەم بە چاوە بەحوکمەکانی چاوی لەو دوور دوورانە کردو گوتی: «دوو لەشکر براکەمانیان گرتووەو دەیبەن بۆ کۆشکی ئیمپراتۆر. بڕیارە سبەینێ بیکوژن؛ هەر بۆیە دەگری.»

چوارەمین براکە دی برای حەوتەم ناڕەحەت بووەو دەیەوێ بگری، گوتی: «نیگەران مەبن! من دەچم و جێی خۆمی لەگەڵ دەگۆڕمەوە. ئیمپراتۆری گەورە با بەکەیفی خۆی من بکوژێ! بەڵکو بەوکارە رازی بێ!»

برای چوارەم لە چاو قووچانێکدا خۆی گەیاندە وێ و بەدزی چووە لای برای سێهەم کە چاوەڕوانی ئەو بوو.

سێهەمین برا گەڕاوە ماڵێ و برای چوارەم جێی ئەوی گرتەوە.





رۆژی دوایی، جەلادەکانی ئیمپراتۆر، زۆر جار تێدەکۆشان برای چوارەمیان بە شمشێرە تیژەکەیان لەناو ببەن بەڵام هەموو جار شمشێرەکەیان لەسەر ئێسقانە ئاسنیەکەی خوار دەبوو و دەشکا. لە کۆتایی دا هەموویان بۆ لای ئیمپراتۆر کە وەکو بروسکە دەی گرماند، رۆیشتن و گووتیان کە ناتوانن زیندانیەکە لەنێو ببەن. ئیمپراتۆری گەورە بە ناڵە ناڵ گوتی: پیاوێک بە ئێسقانی ئاسنی! بەیانی بیخەنە ناو دەریاو نوقمی بکەن.

کاتێ برای چوارەم ئەو فەرمانەی بیست نارەحەت بوو دەستی کرد بە گریان و گوتی: «ئێسکی ئاسن ناچەمێتەوە، بانادرێ و ناشکێ، بەڵام لە ئاودا نقوم دەبێ!»



لە زۆر دوورەوە، لە دەریایەکی جواندا یەکەمین برا دەنگی گریانی ئەوی بیست و گوتی: «براکەمان دەگری. حەتمەن کارەساتیکی بەسەرهاتووە!»

برای دووهەم بە چاوە بە حوکمەکانی خۆی چاوی لەو دوور دوورانە کردو گوتی: «دەیانەوێ براکەمان لە زەریادا بخنکێن؛ هەربۆیە دەگری.»

پێنجەمین برا گوتی: «نیگەران مەبن! دەچم خۆی لەگەڵ دەگۆڕمەوەو دەچمە جێی. ئیمپراتۆری گەورە چەندی پێی خۆش بێ دەتوانێ بمخنکێنێ. بەڵکو بەوکارە رازی بێ!»

برای پێنجەم لە چاو لێکدانێکدا خۆی گەیاندە وێ و بە دزی جێی لەگەڵ برای چوارەم کە چاوەڕوانی ئەوبوو، گۆڕییەوە. چوارەمین برا گەڕاوە بۆ ماڵێ.



سەرتاسەری ڕۆژی دوایە سەربازەکانی دوو لەشکر تێکۆشانْ برای پێنجەم لە زەریا بخنکێنن؛ بەڵام هەموو جارێ لاقی درێژ دەبوو، ئاو تەنیا تا ژێر ئەژنۆی دەهات.







ئەوان برای پێنجەمییان بۆ جێیە قوڵترەکانی زەریا برد بەڵام ئاو تەنیا هەتا سەر سینگی هات.



اشان ئەویان بردە قوڵترین جێی زەریا ئەوجارە
ـ هەتا ملی هات و ئەو هەڵکشا سەرێ و
پۆڵەکانی زەریا وە چەندەی کەوتن.
ێنجەمین برا بەخۆشحاڵییەوە پێکەنی و
تی: «بەه بەه! نەم دەزانی قووڵترین جێی زەریا
ەندە سارد و خۆشە!».



ئیمپراتۆر کە لە تووڕەییان ئاگری لێدەباری، گوتی: «ئەوە پڕ مەترسیترە لەوەی بیرم لێدەکردەوە. ئێستا کەلە ئاودا نقووم نابێ، بەڵکوو بتوانین بیسوتێنین! سبەینێ لە ئاگری داوێین!».











برای پێنجەم بە بیستنی ئەو فەرمانە نارەحەت بوو گریا. لە زۆر دوور ڕا لە دەریایەکی جوان یەکەمین برا دەنگی گریانی ئەوی گوێ لێ بوو. دووهەمین برا بەچاوە بەحوکمەکانی چاوی لە زۆر دوور بڕی و گوتی: «دەیانەوێ براکەمان لە ئاگر خەن و بیسوتێن. هەر بۆیە دەگری.»

شەشەمین برا کە لەسەرمان هەڵدەلەرزی؛ گوتی: «نیگەران مەبن. دەچم و خۆم لەگەڵ ئەو دەگۆڕمەوەو جێی ئەو دەگرمەوە. ئیمپراتۆر با هەر چەندی پێی خۆشە ئەمن بسووتێنێ. بەڵکوو بەو کارە رازی بێ!»

برای شەشەم بەچاو trووکانێک خۆی گەیاندە وێ بەدزییەوە خۆی لەگەڵ برای پێنجەم کە چاوەڕێی ئەو بوو گۆڕییەوە. برای پێنجەم گەڕاوە ماڵێ.









بۆ سبەینێ، سەربازەکانی هەر دوو لەشکر بەولاو لادا دەخولانەوە قرتیلک و لک و پۆپ و دارو سووتەمەنییەکی زۆریان خڕ کردەوە. ئەوان ئاگرێکی گەورەی وایان کردەوە دووکەڵەکەی لەو سەری چینەوە دەگەیشتە ئەو سەری چین. برای شەشەم لە ناوەڕاستی ئاگرەکەدا بوو بەڵام ئەو ئاگرە گەورە نەیدەتوانی گەرمی کاتەوەو بەخۆشحاڵییەوە گوتی: «چ ئیمپراتۆرێکی میهرەبانە! من بە ئاگری خۆی گەرم دەکاتەوە!»







ئیمپراتۆر کە تووڕەیی و غەزەبی وەکو بومەلەرزە زەوی دەخستە لەرزە، فەرمانی دا تیرەندازەکانی ئۆردوی شا ئاگادار بکەن.

بەیانی ئەو پیاوە تیرە باران دەکەین»

شەشەمین برا گریا

له زۆر دوور له دەریایەکی جوان دا یەکەمین برا دەنگی گریانی ئەوی گوێ لێبوو برای دووهەم بەچاوە بەحوکمەکانی چاوی له زۆر دوور کردو گوتی: «دەیانەوێ براکەمان تیر باران کەن، هەر بۆیە دەگری.»

براکان چاویان لەیەک کرد. برای یەکەم گوتی: «ئیدی کارێکمان پێ ناکرێ، بەڵام ناتوانین دەست له براکەمان هەڵگرین، دەچینە وێ ئیمپراتۆر باهەموومان تیرەباران کا بەڵام بەوە چاکە هەموو پێکەوە دەمرین.»



شەش براکان بەرەو کۆشکی ئیمپراتۆر بەڕێکەوتن برای حەوتەم کە پەرۆش بوو ،
نەیتوانی پێش بەگریانی خۆی بگرێ. یەکەمین تنۆکی فرمێسکی بەقەد دووهەمین
چۆمی چین دەبوو بەرەو باکوور بەڕێکەوت.





یەکـەمین تنۆکی فـرمـێـسکی لە باکـوور، لەشکرێکی نوقم کـردو دووەهمین تنۆک لە باشوور، لەشکرەکەی دیکەی قڕ کرد.



شەپۆلێکی گەورە ئیمپراتۆر بەرزکردبۆوەو ئیمپراتۆری ستەمکەر تێدەکۆشا خۆی رزگار کا ئەو سێلاوەی لە فرمێسکەکانی برای حەوتەم ساز بوو لە دیورای چین وەسەرکەوت و لەوبەری دیواری بۆ لای زەریای زەرد وەڕێکەوت.

شەشەمین براش رزگار بوو، بۆلای براکانی کە لە سەر دیوار چاوەڕوانی بوون ڕای کرد.



پێنجەمین برا هاواری کرد: «ماسی!»

شەپۆلی زەریا سەدان ماسی گەورەو قەڵەوی لەگەڵ خۆی بۆ ڕۆخی زەریا هێنابوو لە ڕۆخی زەریا ، ماسییەکان لەبەر پێی برای پێنجەم هەڵبەز دابەزیان بوو. سێیهەمین برا گوتی: «سوخت!» لق و پۆپ و وشکەڵێکی زۆری بۆ ئاگرکردنەوە کۆ کردەوە



برای چوارەم بە قـامکە ئاسنەکانی پلەیەکی لێداو برووسکەی ئاگر وشکەڵەکانی هەڵکرد.
جا پێکەنی و گوتی: «ئەوەش ئاگر!»
حەوتەمین برا گوتی: «برسیمە! ئێستا کە هەمووما‌ن لەیەک کۆ بووینەوە، دەتوانین خواردن بخۆین و بحەسێینەوە، منیش بەڵێن دەدەم هەتا پێویست نەبێ نەگریم!»



حەوت براکە لە دەوری ئاگرەکە دانیشتن و خەریکی خواردنی ماسیە بەتامەکان بوو، پاش ئەو هەموو بەربەرەکانێیە، بە تەواوی برسی ببوون.



